ناوی کتێب: زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ): پیاوە خێرکەرەکە

نووسینی: شادی فقیه

وەرگێڕانی: سەردار ڕەزا

پێداچوونەوەو هەڵەچنی: محەمەد مێرگەیی

نەخشەسازی ناوەوە: محمد علی احمد

ساڵی چاپ: ٢٠١٠ ز

شوێنی چاپ: بەیروت ـ لوبنان

ژمارەی سپاردن: (١١٢٥)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

پێگەی ئەلیکترۆنی: www.nareenco.com

E-mail: nareen@nareenco.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠



الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

المكتب الاسلامي

زنجیرەی

جوانترین چیرۆك

لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# پیاوە خێرکەرەکە




نووسینی
شادی فقیە

وەرگێڕانی
سەردار ڕەزا




الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

ناریـن

المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

میلی کاتژمێرەکە ئاماژەی بۆ حەوتی ئێوارە دەکرد، ئیبراهیم و فاتیمە هەروەکو نەریتی خۆیان بەخێرایی هاتن بۆ ئەوەی لەگەڵ باوکیان کۆببنەوە لە ئێوارە دانیشتنەکەیانداو گوێبگرن بۆ جوانترین چیرۆك ...

# خێرکردن

ئیبراهیم: بابە.. بابە!

باوك: بەڵێ ئیبراهیم.

ئیبراهیم: ئەمڕۆ پارەی خەرجی ڕۆژانەکەم کرد بەخێر، کە دات پێم.

فاتیمە: منیش باوکە گیان بەهەمان شێوە.

باوك: ڕۆڵەکانم چاکتان کرد، لەبەر ئەوەی خێرکردن بەندە لە خواوە نزیك دەکاتەوە، خێرکردن بەڵگەی چاکسازیو چاکەیە.

ئیبراهیم: بەڵێ، من کاتێ کە خێردەکەم هەست بە پشوویەکی گەورە دەکەم، کە لە دڵو دەروونمان هاتو چۆدەکات.

باوك: هەروایە، هەروەکو خوای پەروەردگار ڕزقی کەسی خێرکەر لە شوێنی واوە دەنێرێت، کە کەسەکە حیسابی بۆ ئەو شوێنە نەکردووە، واتە: لەشوێنێکەوە بۆی دێ کە ئەم نایزانێو بیری لێ نەکردۆتەوە. چاکە بە دە ئەوەندەی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە.

خوا بەرەکەتداری بکات بۆتان، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ماڵ بەخێر لێ کردنی کەم ناکات)).

فاتیمە: پاكو بێگەردی بۆ خوا لە کاری خێردا سوودو قازانج هەیە بۆ ئادەمیزاد.

# خێرکەرەکەو دزەکە

باوك: لەبەرئەوەی ئێمە باسی خێرکردن دەکەین، ئێستا چیرۆکێکتان بۆ دەگێڕمەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ بۆ هاوەڵەکانی گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی سوودی خێرکردنیان فێربکات، ئەمەش چیرۆکی خێرکەرەکەیە:

لە زەمانی کۆندا پیاوێك هەبوو خوای پەروەردگار سەروەت و سامانێکی زۆری پێ دابوو، پیاوەکەش سالح و خێرخواز بوو، ویستی هەندێ لە پارەکەی بکات بەخێر، بۆ ئەو مەبەستە هەندێ پارەی هەڵگرت و لە شارەکە ڕۆیشتە دەرەوە، چاوەڕوانی سواڵکەرێکی دەکرد، پاشان چووە ناو گۆڕەپانی شارەکەو سواڵکەرێك لێی نزیك بوویەوە.

سواڵکەرەکە: ئەی پیاوی بەخشندە لەوەی خوا پێی بەخشیووی بەشمان نادەی؟

خێرکەرەکە: فەرموو ئا ئەوە بگرە، پارە پارەی خوایە.

باوك: سواڵکەرەکە پارەکەی وەرگرت و ڕۆیشت، بەڵام خێرکەرەکە گوێی لە خەڵکی بوو، کە پێدەکەنین و گاڵتەیان پێ دەکرد.

خەڵکەکە: کەسێك خێری بە دزێك کرد.

خەڵکەکە: ئەوە کێیە وا خێر بە دز دەکات؟

خەڵکەکە : ئای لەوەی کە پیاوێکی گێلە!!

باوك: پیاوەکە بە قسەی خەڵکەکە خەمبار بوو.

خێرخوازەکە: ئەی خوای پەروەردگار سوپاس و ستایشم بۆ تۆ، خێرم کردوە بە پیاوێکی دز، خوایە لێمی وەرگریت.

فاتیمە: باشە بابە بۆچی خێری بەو دزە کرد؟

باوك: فاتیمە گیان ئەو نەیزانی کە ئەو پیاوە دزە.

ئیبراهیم: ئەی دوای ئەوە چی ڕوویدا ها... بابە؟

## خێرکارەکەو ژنە گوناهبارەکە

باوك: بۆ ڕۆژی دووهەم پیاوەکە چووە دەرەوە بۆ ناو شارەکە.

خێرکەرەکە: سوپاس بۆ خوا پارەی زۆر کردووم، ئەمڕۆش خێری تری لێ دەکەم.

باوك: پیاوەکە بە لای ژنێکدا تێپەڕی کە لە نزیکی بازاڕەکەوە وەستا بوو.

خێرکەرەکە: خوشکەکەم ئەو پارەیە هی خوایە وەری بگرە بۆ خۆت.

ژنەکە: ئەی پیاو چاك زۆر سوپاست دەکەم.

باوك: پیاوەکە دڵی خۆش بوو، لەبەرئەوەی خێری کرد، بەڵام گوێی لێ بوو خەڵکی گاڵتەیان بە خێرکردنەکەی دەکرد.

خـــەڵكی: ئـــەمڕۆ كەســـێك خێـــری بـــە ژنێكـــی گوناهبارو لەخوا یاخی بوو كردووە.

خەڵكی: ئایا ئەوە كارێكی عاقڵانەیە؟

خەڵكی: بەڕاستی كارێكی سەیرە!!

باوك: پیاوەكە ئەو قسانەی بەلاوە ناخۆش بوو.

خێركارەكە: خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ، ئەمڕۆ خێرم بە ژنێكی تاوانبارو لەخوا یاخی كردووە، خوایە لێمی وەربگری.

# خێرکەرەکەو دەوڵەمەندەکە

باوك: لە ڕۆژی سێهەمدا پیاوەکە بە مەبەستی خێرکردن چووە دەرەوە بۆ ناو شارەکە.

خێرکەرەکە: خوای پەروەردگار لە چاکەی خۆیەوە ماڵو سامانی پێ بەخشیووم، منیش خێری لێ دەکەم.

باوك: خێرخوازەکە، دای بە لای ڕێبوارێکدا پێی گوت:

خێرکەرەکە: ئەو خێرە وەربگرە، کە هی خوایە.

پیاوەکە: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە.

باوك: پیاوەکە پارەکەی بردو ڕۆیشت.

خێرکەرەکە: خێرکەرەکە قسەی خەڵکی دەبیست کە گاڵتەیان بە خێرکردنەکەی دەکرد.

خــەڵكی: ئــەمڕۆ خێــر كــراوە بــە بازرگــانێكی ئاڵتون...

خەڵكی: چی؟! خێركراوە بە دەوڵەمەندێك!!

خەڵكی: بەڵێ... بەڵێ...

خەڵكی: بەڕاستی كارێكی سەرسوڕهێنەرە!!

باوك: پیاوەكە خێركەرەكـە بـەو تانـەو تەشـەرانە زۆر پێی خەمبار بوو.

**خێرکەرەکـە:** ئـای خوایـە گیـان ئـەوە چـییە؟ هـەموو ڕۆژێـك خێرەکان دەچن بۆ لای ئەو کەسانەی شایستەی نەبوون.

**ئیـبراهیم:** باشـە بابـە گیـان. ئایـا پیـاوە دەوڵەمەندەکـە خێـری وەرگرت؟

**باوك:** بەڵێ ئیبراهیم، وەریشی گرتو زۆر تەریق بوویەوە.

**فاتیمە:** ئای لەو پیاوە داماوە، دیارە زۆر خەفەتبار بووە.

**بـاوك:** بـەڵێ زۆر ئـازاری پـێ گەیـشتو دەسـتی کـرد بـە لـەخوا پاڕانەوە.

**خێرخوازەکە:** ئەی پـەورەردگارم! مـن چوومە دەرەوە خێربکـەم مەبەسـتم لـە خێرکردنەکـە خـاوەن پێویـستیو نـەدارەکان بـوو، بـەڵام ئەوانـەی خێرەکـەم پێـدان، یەکـەم دز بـوو، دووهـەم تاوانبـارو لـەخوا یـاخی بـوو، سێهەمیـشیان دەوڵەمەنـد بـوو. نازانم بۆچی لە خێرکردنەکەمدا سەرکەوتوو نەبووم؟

# خەوە چاکەکە

باوك: پیاوچاکەکە بە خەفەتەوە خەوی لێکەوت، لەبەرئەوەی خێرەکانی داوە بە کەسانێ کە شایستەی نەبوون لەکاتێکدا کە ئەو خەوتبوو، لەخەویا کەسێکی نورانی بینی لە سیماو روخساری پیاوچاکانی هەبوو، پێی گوت:

ڕوخسار نورانییەکە: ئەی چاکەخواز، ئەوخێرەی بە دزەکەت کرد، بووە هۆی تەوبەکردنی و وازهێنانی لە دزی کردن.

باوك: دیسان پێی گوت:...

ڕوخسار نورانییەکە: خێرکردنەکەشت کە دات بە ژنە گوناهبارە لەخوا یاخییەکە، بووە هۆی پاکداوێنی بۆی.

باوك: پێیشی گوت...

ڕوخسار نورانییەکە: خێرکردنەکەشت بە دەوڵەمەندەکە وای لێ کرد تەریق ببێتەوەو بەخۆیدا بچێتەوەو ئەویش دەست بکات بە بەخشینەوە لە سامانەکەی بەسەر داماواندا.

**باوك:** كاتێ پیاوچاكەكە لە خەوەكەی خەبەری بوویەوە، سوجدەی بۆ خوای پەروەردگار برد، لەبەر ئەوەی ئەو نیعمەتانەی پێبەخشیوەو سەركەوتووی كردووە، لەبەرئەوە یارمەتی خەڵكی دەدات لەسەر تەوبەكردنو گەڕانەوەیان بۆ لای خوای لێبوردە، بەبێ ئەوەی خۆشی هەست بەوە بكات.

ئیبراهیم: ئەوە چۆنە بابەگیان ؟ بۆمانی ڕوون بکەرەوە.

باوك: لەبەرئەوەی نیەتو دڵ و دەروونی ئەو پیاوە ڕاستو پاك بووو لەبەر ڕەزامەندی خوا بوو، لەبەر ئەوە خواش یارمەتی دا بۆ ڕێنمویی کردنی خەڵکی بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ.

فاتیمە: کەواتە خوا خێرەکەی لێ وەرگرت؟

باوك: بەڵێ: ڕۆڵەکانم لێی وەرگرت، چونکە ئەو پیاوە لە خێر کردنەکەی نیەتی ڕەزامەندی خوا بوو، خواش بەپێی نیەتی ئەو بەندەیەی بۆی حیساب دەکات، گەرچی ئەو خێرە بکەوێتە دەستی کەسانێکەوە شایستەش نەبن، چونکە ئەو خێرخوازە ئەو کەسە ناناسێ، کە خێرەکەی پێ دەکات، یاخود مەبەستی خێرخوازەکە چاکسازییە.

فاتیمە: بەڕاستی بابە گیان پەندێکی جوانە.

ئیبراهیم: ئینشائەڵلا منیش دەبمە کەسێکی خێرکەر بە بەردەوامی.

باوك: ڕۆڵەکانم من ڕاتان دەسپێرم کە هیچ کاتێك داواکاری خەڵك ڕەت مەکەنەوەو دوودڵ مەبن تیایداو بەشیان بدەن چونکە ئاکاری پێغەمبەری خوا ﷺ و هەموو پیاوچاکان ئاوەها بوو ، لەوانەیە ئەوەی داوای شتێکت لێ دەکات لە لایەنی خواوە نێررابێت بۆ لای تۆ، کەواتە بەدڵشکاوی مەیگێڕەرەوە، لەوانەیە خوا بیەوێت بەهۆی ئەو چاکەکردنەتەوە ئازارێکت لێ دووربخاتەوە.

فاتیمەو ئیبراهیم: بابەگیان ئێمە لەگەڵ گومانی باشی تۆدا دەبینو هیچ کاتێ پێویستی نەداران ناگێڕینە دواوەو یارمەتییان دەدەین.

باوك: ئافەرین بۆ ئێوە ڕۆڵەکانم.

